دالیا سیراجەدینم دەکرد لە شوێنێکی ئەم دونیایەوە سەر هەڵبداتەوەو خۆی هەندێک بەشی تایبەتی ئەم کتێبە بنوسێت. هەر فرۆکەخانەیەک دەچووم چاوەڕوان بووم یەکێک بانگمبکات «مامۆستا... مامۆستا، بەڕێز، بەڵێ لەگەڵ تۆمە. تۆ مامۆستای نوسەر عەلی شەرەفیاریت، وا نییە.. تۆ ئەو نیت؟». لە هەموو وێستگەی شەمەندەفەرەکانی دونیادا، لە هەموو فرۆکەخانەکانی دونیادا بۆ شاروخی گەڕام و نەمدۆزییەوە. لەو نێوەندەدا دووجار بە نهێنی گەڕامەوە بۆ کوردستان، هەر دوو جارەکە مستەفای شەونمم لە چێشتخانەکاندا دۆزییەوە، جارێکیان چووین بۆ لای موسای بابەک، جگە لەو نامە سەیرەی دالیا سیراجەدین هیچ زانیارییەکی تازەیان نەبوو. سالان و مانگان ڕۆی و هیچ شتێکی دی ڕوویندا. من لە ئەڵمانیا ڕۆژێک چوومە سەر گۆڕی «سباستیان میوولەر». ئەو پیاوەی کە دەبایە بە زیندووی ببینم. بێدەنگی ئەبەدی ئەو لای من وەک سمبولێکی گەورەی بێدەنگی ئەبەدی نهێنییەکان و کۆتایی سەردەمی ئەفسانەکان بوو. دەکرا ئەو پیاوە گەلەک سەرە داوی دیکەم بۆ ئاشکرابکات، گەلەک نیگای ترم بداتێ و دەروازەی ترم بۆ بکاتەوە، بەلام ئەو بێدەنگییە ترسناکەی دوای ڕۆیشتنی جەلادەتی کۆتر هەموو شتێکی داگرت، بێدەنگییەکی سەرتاسەریی بوو. ئەو لەو کەسانە بوو کە لە خۆیان زیاتر کەسی دی نییە تەفسیریانبکات. ئەو ڕۆژە چەپکێک گوڵی چکۆلەم خستە سەر گۆڕی سباستیان میوولەر و لەگەڕانەوەمدا لە دوکانێکی «هیندی» نزیک بانهۆفی دوسلدۆرف وێنەیەکی گەورەی کریشنام کڕی، هەر ئەو ڕۆژە لای فۆتۆگرافێک وێنەیەکی جەلادەتی کۆترم بە گەورەکردندا، بە هەمان شێوەو بە هەمان قەوارەی وێنەکەی کریشنا، وێنەیەکی گەورەبوو، لە یەکێک لە کۆنسێرتەکاندا گیرابوو، جەلادەت لەویادا فلووتەکەی بەدەستەوەیەو ئاوڕی داوەتەوەو سەیری کامێراکە دەکات، ڕیشێکی درێژ و نیگایەکی گەش و جووتێک چاوی

سیحراوی هەیە، لە پشتییەوە چاوی ڕەوشەنی مستەفای سەقزی و بەشێک لە جەلیلی باران دەرکەوتووە. من ئەو دوو وێنە گەورەیە بەرابەر یەکتری دادەنێم و بەردەوام سەیریاندەکەم، چەند ساڵێک بە تەنیا لە قاتی سیازدەی خانوویەکی بەرزدا لە شەقامی «کۆنراد ئادنهاوەر» لە کوێلن، لە ژوورێکدا کە بەسەر ڕایندا دەڕوانێت دەمێنمەوەو شەوو ڕۆژ ئەم کتێبە دەخوێنمەوە، بەردەوام سەیری چاوەکانی جەلادەت دەکەم. بەردەوام سەیری یەکتری دەکەین، نە من دەتوانم هیچ بەو بڵێم و نە ئەو دەتوانێت هیچ بە من بڵێت، ئەو منی تا سەر سنووری خەیاڵیترین شاری دونیا بردو من دەبێت ئەو بەرەو سەر زەمینی حەقیقەت بەرم، ئەو هەموو خەیاڵی قووڵ و مەزنی خۆی دا بە من و دەبایە من هەموو حەقیقەتی ئەو بنوسمەوە. هەستمدەکرد ئەو دەستنوسەی ئەو بردی بۆ شاری مۆسیقاره سپییەکان، ئەو کۆپییەی مستەفای شەونم لە سەر ڕەفەی کتێبخانەیەکی ئۆقیانوسی هاواردا هەڵیگرت تەمەنیان لەتەمەنی ئەم چیرۆکەی من زیاتر دەبێت. وەک چۆن یەکێک لە مردن دەترسێت ئاوها لە چاپی ئەو کتێبە دەترسام. هەموو خولیای ئەو سالانەی من ئەوەبوو ئەم تێکستە بگەیێنمە ئەو جێگایەی جەلادەتی کۆتر باسیدەکرد، تخوبێک لە نێوان ژیان و مردندا، تخوبێک بتوانێت لەوێوە لە نێوان ئێستاو ئەبەدییەتدا یاریبکات. ڕۆژێک لە ڕۆژان دوای چوار ساڵ لە ئیشکردنی بەردەوام و چاوەڕوانی بەردەوام بڕیارمدا کە ئیدی هەرچییەک بێت دەبێت ئەم تێکستە بێتەدەرێ. ئەوکات دڵنیابووم هیچ حەرفێکی دیکەی نوێ نایەتە پێش تا بیخەمە سەر ئەم کتێبە، لە سەفەرێکی دیکەدا گەڕامەوە بۆ وڵات، بەر لەوەی بەخۆم دەستنوسەکەوە بچم بۆ چاپخانە لە ئاست ئەو ئوتێلە گەورەیەدا وەستام، ئوتێلێکی تازە و درەوشاوە و گەورە کە میوان لەسەرتاپای دونیاوە ڕویان تێدەکرد. لەوحێکی گەورەی لەسەربوو کە بە گڵۆپی ڕەنگاوڕەنگ دەدرەوشایەوە، لەسەری نوسرابوو «سیتی

پالاس». بە ئەسپایی پارچە گەچێکی کەوتووم لەسەر شەقامەکەی پێشدەمم هەڵگرت و بە خەتێکی زۆر گەورە لەسەر دیوارە تازەکەم نوسی «گێلاسی سپی». لەو ساتەدا حەزمدەکرد هەموو مۆسیقارو شاعیرەکان و نیگارکێشەکانی ئەم شارە بێن و لە یادی جەلادەتی کۆتردا لەسەر هەموو دیوارەکان و لە هەموو لاکانەوە بنوسن «گێلاسی سپی»، خەونێک بوو کە هەرگیز نایەتەدی. بێئەوەی کەس بمبینێت بە خۆم و دەستنوسەکەوە دوورکەوتمەوەو چووم بۆ چاپخانە. لەم دیو دەرگای چاپخانەوە یەکێک لە دوور بانگیکردم: مامۆستا... مامۆستا، بەڕێز، بەڵێ لەگەڵ تۆمە، ئا بەڵێ جەنابت، بەڵێ، تۆ جەنابت مامۆستای نوسەر عەلی شەرەفیاریت؟ وا نییە.. تۆ ئەو نیت؟.

کوڕێکی سپیپۆشی گەنجە، بە ڕوخسارێکی سپییەوە، بە قژێکی درێژ و چڕەوە. من دەڵێم: بەڵێ من ئەوم، من عەلی شەرەفیارم.

ئەو نامەیەکم دەداتێ و دەڵێت: بەڕێز ئەم نامەیە بۆ تۆیە. دەبێت بیخوێنیتەوە، زۆر گرنگە بیخوێنیتەوە.

من نامەکە وەردەگرم و ئەو دەڕوات.

نامەکە دەکەمەوەو لە خوارەوە ناوی جەلادەتی کۆتر دەبینم.

من لە بەر دەرگای ئەو چاپخانەیە دەوەستم، نەدەتوانم بڕۆمە دواوەو نەدەتوانم بچمە پێشێ، ئێستێک دەکەم و سەیری ئاسمان دەکەم، چاو لێکدەنێم و هەموو شتێک بە خێرایی بە پێشدەممدا تێدەپەڕێت، بێئەوەی ئەو نامەیە بخوێنمەوە دەیخەمە گیرفانم، دەزانم هەرگیز ئەو نامەیە ناخوێنمەوە، هەرگیز. بە هێمنی دەچمە ناو چاپخانەکەوەو کتێبەکەم دادەنێم... دوا ڕستەی ئەو لە گوێمدا دەزرنگێتەوە کە دەڵێت : ئەم چیرۆکە هەرگیز لای تۆ کۆتایی نایەت.

بەلام... هەموو شتێک تەواو... هەموو شتێک تەواو...

کتێبەکەم دەخەمە سەر مێزی خاوەنی چاپخانەکەو لە بری سڵاو پێیدەڵێم: ماڵاوا ئەی قەقنەس... ماڵاوا. ئەو لێمدەپرسێت: مامۆستا دەڵێیت چی؟. من بێئەوەی بزانم چی وەڵامبدەمەوە، وەک شێت دەڵێم: نا، بەڕێز هیچ نییە، هیچ نییە... هێندە هەیە سەرەتای گۆرانییەکی کۆنم بیرکەوتەوە کە دەڵێت: ماڵاوا ئەی قەقنەس ماڵاوا... ماڵاوا ئەی قەقنەس ماڵاوا.. ماڵاوا... ماڵاوا!!!.

## کتێبە چاپکراوەکانی ئەندێشە

| ناوی کتێب | ناوی نووسەر | ناوی وەرگێڕ |
|---|---|---|
| ١. بنەڕەتەکانی فەلسەفە | د. حەمید عەزیز | |
| ٢. کورد لەدیدی ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە | د. فەرهاد پیربال | |
| ٣. ڕێبازە ئەدەبییەکان | د. فەرهاد پیربال | |
| ٤. نەتەوەی زێرابەکان | جەبار جەمال غەریب | |
| ٥. ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی | د. جەعفەر عەلی | |
| ٦. سۆفیزم و کاریگەری لەسەر بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی... | د. جەعفەر عەلی | |
| ٧. مەحوی لەنێوان زاهیرییەت و باتینییەت و ... | د. ئەحمەدی مەلا | |
| ٨. نهێنییەکانی ژیان | ئۆشۆ | ئازاد بەرزنجی |
| ٩. کورتیلەیەک لە مێژووی کات | ستیڤن هۆوکینگ<br>لیۆنارد ملۆدیتۆ | حوسەین حوسەینی<br>د. هیوا عومەر |
| ١٠. کۆشک | فرانتس کافکا | عەتا نەهایی |
| ١١. فەصلول مەقال | ئیبن ڕوشد | مەریوان عەبدول |
| ١٢. شۆڕشی ئەیلوول لەبەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا | وریا ڕەحمانی | |

| | | |
|---|---|---|
| ١٣. دەسەڵات و جیاوازی | مەریوان وریا قانیع | |
| ١٤. لە چ ئێستایەکدا دەژین | مەریوان وریا قانیع | |
| ١٥. شوناس و ئاڵۆزی | مەریوان وریا قانیع | |
| ١٦. دین و دونیا | مەریوان وریا قانیع | |
| ١٧. سیاسەت و دونیا | مەریوان وریا قانیع | |
| ١٨. کتێب و دونیا | مەریوان وریا قانیع | |
| ١٩. دواهەمین هەناری دونیا | بەختیار عەلی | |
| ٢٠. ئێوارەی پەروانە | بەختیار عەلی | |
| ٢١. جەمشید خانی مامم | بەختیار عەلی | |
| ٢٢. مەرگی تاقانەی دووەم | بەختیار عەلی | |
| ٢٣. کەشتی فریشتەکان (١) | بەختیار عەلی | |
| ٢٤. کەشتی فریشتەکان (٢) | بەختیار عەلی | |
| ٢٥.شاری موسیقارە سپییەکان | بەختیار عەلی | |
| ٢٦. سێوی سێهەم | بەختیار عەلی | |
| ٢٧. لە دیارەوە بۆ نادیار | بەختیار عەلی | |
| ٢٨. وەک باڵندەی ناو جەنگەڵە ترسناکەکان | بەختیار عەلی | |
| ٢٩. چێژی مەرگدۆستی | بەختیار عەلی | |
| ٣٠. ئەی بەندەری دۆست، ئەی کەشتی دوژمن | بەختیار عەلی | |
| ٣١. مەعریفە و ئیمان | بەختیار عەلی<br>هێمن قەرەداخی | |
| ٣٢. دۆزی کورد لە بازنەی پەیوەندییەکانی ئەمریکاو... | گۆران ئیبراهیم صاڵح | |
| ٣٣. سەمەرقەند (چ٢) | ئەمین مەعلوف | د. ئەحمەدی مەلا |

| | | |
|---|---|---|
| ٣٤. ویستگەیەک لە گەشتێکی فەلسەفی | فاروق ڕەفیق | |
| ٣٥. ئەخلاقناسی | تەحسین حەمە غریب | |
| ٣٦. گەشەسەندنی ڕامیاری... | د. ک. پێسچانی | د. ئارام عەلی |
| ٣٧. مێژووی کۆنی کورد (چ٢) | د. جەمال ڕەشید | |
| | د. فەوزیە ڕەشید | ملکۆ کەلاری |
| ٣٨. منداڵی گەڕەک | هیوا قادر | |
| ٣٩. مرۆڤی یاخی | ئەلبێر کامۆ | ئازاد بەرزنجی |
| ٤٠. پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەرێم و دەوڵەتانی... | هێرش جەوهەر مەجید | |
| ٤١. مێژووی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و سیاسی... (چ٢) | فریشتە نورائی | هەورامان فەریق کەریم |
| ٤٢. سلێمانی لەنێوان ساڵانی (١٩٤٥-١٩٥٨) | توانا ڕەشید کەریم | |
| ٤٣. شاری سلێمانی (١٤ی تەموزی ١٩٥٨-١٧ی تەموزی ١٩٦٨) | هەوراز جەوهەر مەجید | |
| ٤٤. کتێبی پەراوێزنووسان | عەتا محەمەد | |
| ٤٥. فیکر و دونیا (بەرگی ١) | مەریوان وریا قانیع | |
| ٤٦. فیکر و دونیا (بەرگی ٢) | مەریوان وریا قانیع | |
| ٤٧. دین و دونیا (چ٢) | مەریوان وریا قانیع | |
| ٤٨. کتێب و دونیا (چ٢) | مەریوان وریا قانیع | |
| ٤٩. کۆمەڵگەی ڕەش | د. عادل باخەوان | |
| ٥٠. زستانێکی درێژ | کولم تویبێن | دلاوەر قەرەداغی |
| ٥١. فرانسیسکۆس قەدیسی من | نیکۆس کازانتزاکیس | دلاوەر قەرەداغی |
| ٥٢. ئاهەنگی تەگەکە | ماریۆ بارگاس یۆسا | جەلیل کاکەوەیس |

| | | |
|---|---|---|
| ٥٣. شەوی لیشبۆنە | ئێریش ماریا ڕیمارک | کەریم پەڕەنگ |
| ٥٤. من و ئەو | ئەلبێرتۆ مۆرافیا | کارزان عەلی |
| ٥٥. میرنامە | جان دۆست | سەباح ئیسماعیل |
| ٥٦. ڕوخسارە بەندکراوەکەم | لەتیفە | ڕووناک شوانی |
| ٥٧. قەپێلک | مستەفا خەلیفە | هەورامان وریا قانع |
| ٥٨. خەونی پیاوە ئێرانییەکان<br>کەوتنی بۆرە قەڵا | ماردین ئیبراهیم | |
| ٥٩. گرگن | پێر لاگەرکڤیست | خەبات عارف |
| ٦٠. ١٩٨٤ | جۆرج ئۆروێل | حەکیم کاکەوەیس |
| ٦١. سوور و ڕەش | ستاندالْ | سیامەند شاسواری |
| ٦٢. دەستنووسە دۆزراوەکەی ئەکرا | پاولۆکۆیلۆ | سیروان مەحمود |
| ٦٣. جادەی مێخەک (١) | دلاوەر قەرەداغی | |
| ٦٤. جادەی مێخەک (٢) | دلاوەر قەرەداغی | |
| ٦٥. ئێوارستان | پێر لاگەرکڤیست | خەبات عارف |
| ٦٦. دارستانی نەرویجی | هاروکی موراکامی | تارا شێخ عوسمان |
| ٦٧. ئێوارەی پەروانە (چ٦) | بەختیار عەلی | |
| ٦٨. شاری مۆسیقارە سپییەکان (چ٣) | بەختیار عەلی | |
| ٦٩. مەرگی تاقانەی دووەم (چ ٥) | بەختیار عەلی | |
| ٧٠. کۆشکی باڵندە غەمگینەکان (چ٢) | بەختیار عەلی | |
| ٧١. تا ماتەمی گوڵ...<br>تا خوێنی فریشتە (چ٣) | بەختیار عەلی | |
| ٧٢. سێوی سێهەم (چ٣) | بەختیار عەلی | |
| ٧٣. ئاورەکەی ئۆرفیۆس | بەختیار عەلی | |
| ٧٤. غەزەلنوس و<br>باغەکانی خەیاڵ (چ٢) | بەختیار عەلی | |

٧٥. ئەی بەندەری دۆست،
ئەی کەشتی دوژمن (چ٢)    بەختیار عەلی
٧٦. دواهەمین هەناری دونیا (چ٥)    بەختیار عەلی
٧٧. ئێمەی پەنابەر    کۆمەڵێ نووسەر
٧٨. گرەوی بەختی هەڵاڵە (چ٢)    عەتا نەهایی
٧٩. عێراقییەک لە پاریس    سەمۆئێل شەمعون    سەباح ئیسماعیل
٨٠. جیهانی سۆفیا و
فەرهەنگی سۆفیا (چ٤)    یۆستاین گاردەر    بەهرۆز حەسەن
٨١. کچەی پرتەقاڵ (چ٣)    یۆستاین گاردەر    بەهرۆز حەسەن
٨٢. لە ئاوێنەیەکدا،
لە نهێنییەکدا (چ٢)    یۆستاین گاردەر    بەهرۆز حەسەن
٨٣. کچی بەڕێوەبەری سێرک (چ٢)    یۆستاین گاردەر    بەهرۆز حەسەن
٨٤. نهێنی یاری کاغەز (چ٢)    یۆستاین گاردەر    بەهرۆز حەسەن
٨٥. مایا (چ٢)    یۆستاین گاردەر    بەهرۆز حەسەن
٨٦. ئینسایکلۆپیدیایەکی
مێژوویی وێنەدار    کۆمەڵێ نووسەر    هەورامان وریا قانع
٨٧. کێشەی کورد لە
ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا    د. حامد مەحمود عیسا    زرار عەلی
٨٨. دوالیزمی دژیەک لە هۆنراوەلیریکییەکانی
مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزی دا    لهۆن قادر
٨٩. فەلسەفەی ئایین (چ٢)    ئازاد قەزاز
٩٠. سایکۆپۆلیتیک (چ٢)    ئازاد قەزاز
٩١. خۆت بناسە    ئازاد قەزاز
٩٢. مەسیح لە
خاچ دەدەنەوە (چ٢)    نیکۆس کازانتزاکیس    دلاوەر قەرەداغی

٩٣. قەدەغەشکێنی (چ٢) مەولود ئیبراهیم حەسەن

٩٤. گەڕان بەدوای نەمرییدا (چ٢) مەولود ئیبراهیم حەسەن

٩٥. پێکهاتەی ئەفسانەی کوردی (چ٢) مەولود ئیبراهیم حەسەن

٩٦. فەلسەفەی بوون د. محەمەد کەمال

٩٧. وەک ڕووبارە بەخووڕەکە پاولۆکۆیلۆ سیروان مە